


ناوی: چەند ڕێنموییەك بۆ بوك و زاوای موسلمان

بابەت: كۆمەلایەتی

نوسەر: باوكی ئاوارە

وەرگێر: ×

پێداچونەوە: نوسەر

كۆمپیوتەر: نوسینگەی MOON ٠٦٦ ٢٦٤٨٩٠٧ / N

پاك نوسكردن: زیوەر ئەنوەر

چاپخانە: تازە

چاپ: شەشەم ٢٠١٢

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

ژمارە: ﴿٧٢﴾

نرخ: ١٥٠٠ دینار

بۆ: فرۆشتن و بلاوكردنەوە: ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ / M

بۆ: هونەركاری وچاپكردن: ٠٧٥٠١١٨١٩١٩ / M





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی ٩٢٢ ی ساڵی (٢٠٠٧)ی پێدراوە





# چەند ڕێنموییەك

# بۆ

# بوك و زاوای موسوڵمان

ئامادەكردنی

باوكی ئاوارە

شەشەم چاپ

٢٠١٢

بسم الله الرحمن الرحيم

## • پێشەكی

الحمد الله رب العالمين، والصلاة والسلام على قائدنا و مقتدانا محمد صلى الله عليه وسلم.

وبعد:....

- جیهانی جنس، جیهانێكی كاریگەرو فراوان و گرنگی ژیانی مرۆڤە و، پەیوەستە بە بەختەوەری و تاڵی ژن و مێرد.

- هەبوونی ڕۆشنبیری جنسیش، پێویستی زۆری گەنج و لاوی موسڵمانە.

ئیسلامیش ئاراستەكاری شارەزا بوونیەتی لە ژێر پەردەی داوێن پاكی و عیفەت و نەبزواندن و وروژاندنیدا.

جا دانانی كتێب لەسەر ڕوون كردنەوەی مەسەلەی جنس لە ژێر ڕۆشنایی



چەند ڕێنموییەك بۆ بوك و زاوا

ئایەتەكانی خواو فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ و وتەی زانایان، خشتێكی دیواری بانگەوازی ئیسلامی تێك هەڵكێش دەكات، گەنج و لاوانیش لە لیتاوی چلێیسی جنسی ڕزگاری دەكات و، ڕۆشنبیریەكی جنسی پاكیان پێ دەبەخشێت.

چونكە لەبازاڕەكاندا چەندەها كتێب هەن، كە بەئاراستەی ماسۆنیەتی ڕووخێنەری ڕەوشت و ئاكاری بەرز و نوسراون، كە باسی جنس دەكات بەمەبەستی دەست تێكەڵ كردنی ناڕاست بۆ كوڕو كچ و بڵاوبوونەوەی زیناو لادانی گەنجەكان و وروژاندنی جنس لە نێوان گشت چین و توێژێكدا.

- جا بۆ ئەوەی گەنج و لاوەكانمان بە كوڕ و كچەوە نەكەونە تەڵە و فێڵیان و، بە هەڵە لە مەسەلەی جنس تێنەگەن، بەندە ئەم

نامیلکەیە دەخاتە بەر دەستیان، کە باسی مەسەلەی جنس دەکات لە ژێر تەوجیهاتی قورئان و سوننەت کە، ڕاشکاوانە هەندێ شت وتراوە، کە پێوستە باس بکرێ، تا بە شێوەیەکی ڕاست و عیفەت، ڕۆشنبیری جنسی وەربگرین.

دیارە ئیسلامیش کە گرنگی بە هەموو بوارەکانی ژیانداوە، بەهەمان شێوە گرنگی یەکی زۆری بە ئادابی جنس داوە و بە ڕاشکاوی و بە بێ پەروا باسی کردووە.

هەروەها پێشینەی ئێمەش کتێبیان داناوە و بە ڕاشکاوی (صراحە) و بێ پەروا لەسەریان نوسیوە، وەك ئیمام ئیبن حەزمی ئەندەلوسی رحمه الله لە کتێبەکەی (طوق الحمامة)و، (إبن قیم الجوزی) رحمه الله لە کتێبەکەی (روضة المحبین ) دا باسیان کردووە.



چەند ڕێنموییەك بۆ بوك و زاوا

لەبەر ئەوەی خوێنەری بەڕێز بە لاتەوە نامۆ و (صدمە) نەبێ، کەلەم نامیلکەیە بەڕاشکاوی باسی پەیوەندی جنسی ژن ومێرد کراوە، تۆمەتی خراپیش مەدەنە پاڵمان و گازاندەمان لێمەکەن، چونکە ئەوەی لەم نامیلکەیە دا باس کراوە، دەرهێنراوی گیرفانی خۆمان نیە، بەڵکو بەڵگەی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ و وتەی زانایان پاڵپشت و پتەو کردنیەتی.

لە خوای بەخشندە داواکارم هەموو بوك و زاوایەکی موسڵمان بەیەك شاد بکات و، بەختەوەری ژیانێکی ئیسلامیان پێ ببەخشێ، بە هیوای وەچەو نەوەیەکی پەروەردەکراوی ئیسلامیی.

پاشان لە ئێوەش داوام وایە لە دوعای خەیر بێ بەشمان نەکەن.

باوکی ئاوارە

سلێمانی /٨/١/١٩٩٦

## شەوی یەکەمی
## بەبوک گەیشتن.

یەکتر ناسین و خۆشەویستی و دەر بڕینی دوو دڵ.... دوو عاشقی یەکتر.... بوک و زاوا، جیهانێکی سەیر و سەمەرەیە و حەساس و غەریب و ناسکە و تابڵێی هەستیارە.

لەم شەوەدا دووکەسی نەناسراو یەکتر دەناسن، چرای سەرەتای بەختەوەری ژیانیان دا ئەگیرسێنن، بە هیوای ڕۆشنکردنی خۆیان و دەوروبەریان.

جا بۆ ئەم مەبەستە لێرەوە باسی چۆنیەتی هەڵسو کەوت و مامەڵەی دروستی بوک و زاوا دەکەین، لەم شەوە بێ وێنە و حەساسەی دیاری کەری خۆشەویستی دا، ئەویش لەژێر ڕۆشنایی و





**تیشکی ڕێنموییەکانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی و زانایان و زانستدا.**

**بە شێوەیەکی عیفەت و دوور لەبەڕەلایی بەد ڕەوشتی، بۆ ئەوەی بوک و زاوای موسڵمان، کە لە ژوورێکی ڕازاوەی ڕەنگاو ڕەنگی دڵڕفێن کۆدەبنەوە بەبەر چاو ڕۆشنی و شارەزایی و ژیرانە ڕۆژ بەسەر شەوەکە بێنن و، بتوانن شیلەی گوڵاڵەی یەکتری بمژن.**

**جا بۆ ئەم مەبەستە چەند ڕێنموویی و تەو جیهاتی گرنگ دەخەینە بەر دەست، کە پێویستە بوک و زاوا، پەیڕەوی بکەن و لەخۆیان بهێننە دی.**

* * *

## نوێژ كردنی بوك و زاوا

هەر لەو كاتە بوك و زاوا خودا حافیزی لە خزم و كاریان دەكەن و، دەچنە ژووری ڕازاوە و ڕەنگاو ڕەنگی جیهانی سەرەتایی ژیانی بەختیاری، واچاكە هەردووكیان نوێژی بوك گواستنەوە (صلاة الزفاف) بكەن.

تا ڕوون بێتەوە، كە ژن و مێردایەتی تەنها چێژ و شادیەكی كاتی نیە، بەڵكو بەجێهێنانی ئەركێكی دینی خوایەو پێكهێنانی خێزانی ئیسلامیە.

عبدالله ی كوڕی مسعود ﷺ ئامۆژگاری پیاوێكی دەكرد، كە كچێكی مارە كردبوو، پێی ووت: گەر شەوی زاوایی، بوك هاتە لات، پێی بڵێ: بادوو ڕكات نوێژت لەگەڵدا بكات و تۆش بڵێ: (اللهم





بارك لي فی اهلي وباركهم فی، اللهم اجمع بيننا ما اجمعت بخير، وفرق بيننا اذا فرقت بخير)[١]

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (اذا تزوج ادحكم امراة فليأخذ بنا صيتها ويسم الله عزوجل، وَلْيدعُ بالبركة وليقل اللهم اني اسألك من خيرها وخير ما جبلتها عليه، واعوذ بك من شرها وشر ماجبلتها عليه )[٢].

واتە: گەر یەكێك لە ئێوە ژنی هێنا و گواستیەوە، با لە ژوورەوە دەست بە نێوچەوانیدا بهێنێ و ناوی خوا بێنێ و داوای خێرو بەرەكەت بكات و، بڵێ: خوایە داوای خەیرو خۆشی و چاكی خوڕەوشت و ڕەفتاری ئەم ئافرەتەت لێدەكەم، هەروا پەنا بە تۆ دەگرم لە خراپە كاری و خراپەی ڕەفتاری ئەو.

❋ ❋ ❋

[١] - ئەبو داود ڕیوایەتی كردووە بە پلەی( حسن ).
[٢] - بوخاری و ئەبوداودو غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان كردووە.

## لاواندنەوەو قسەی خۆش

- شاراوە نیە کەلەشەوی یەکەمدا، ئافرەت هەست بە غەریبی وترس وشەرمێکی زۆر لە زاوا دەکات، لەبەر ئەوەی ڕێنموییەکی راستەقینەی کە ئیسلامی نەکراوە ولەلایەن دایکەوە، کەئەمە ئەرکی سەرشانیەتی، کە لەبری ئەوخەڵکێکی تردەسەت دەکەن بەهەڵە تێگەیاندنی.

- شەوی یەکەمیش حەساسترین و دەقیقترین دیاریکردنی خۆشەویستی بوك وزاوایە، لەبەر ئەوەی هەڵس و کەوت ومامەڵە و ڕەفتار لەم شەوەدا، پێویستە زۆر بەوریایی و هێمنی و لەسەر خۆیی بێ.

- پیاوی موسڵمانی ژیرو لێزان و رۆشنبیریش ئەو کەسەیە، کە زۆر بەسۆز و



چەند ڕێنموییەك بۆ بوك و زاوا

عاتیفە وخۆشەویستیەوە، پێشوازی لەم دڵ ناسك وترساو شڵەژاوە دەکات و، بەنەرم و نیان ترین شێواز ڕەفتاری لەگەڵ دەکات.

- لەکۆمەڵگەی ئێمەدا بەگشتی، زۆربەی پیاو (زاوا) لەبەر تێنەگیشتنیان و، لەبەر نەبونی رۆشنبیریەکی جنسی لەم شەوەدا، توشی دوو هەڵەی سەرەکی وبنەرەت دەبن کە:

١- هەموو خەم وگرینگیەك لەلای ئەو، تەنها لادانی پەردەی کچێنی یە.

جا بەهەر ڕێگەو وەسیلەو شێوازێك بێت، کەئەمەش دەبێتە هۆی بوونی پەیوەندیەکی وشك لەنێون یەکتریدا.

٢- زاوا بەحوکمی واقیعەوە، وا لە بوك چاوەڕێ دەکات، کەئەم کارە قەبوڵ بکات و، پێی ڕازی بێت بەبێ پیادەکردن و پەیڕەو کردنی پێشەکیەکانی سانا لادانی پەردەی کچێنی.

- جا ئەگەر کەسانی گەمژە، ئەم دڵ ڕەقی وتوند و تیژیەیان پێ پیاوەتی (رجولە) بێت لەگەڵ ئەم ئافرەتە خاوەن شەخصی یەتە، ئەوا بەپێچەوانەوە ئیسلام نەرم ونیانی ورەفتار چاکی لەگەڵ ئافرەت، بەتایبەتی لەم شەوەدا بەپیاوەتی دادەنێ.

* * *



چەند ڕێنموییەك بۆ بوك و زاوا

## • زاوای بەڕێز:

دوای ئەوەی نوێژەکەتان ئەنجام داو، دوعای خێرت کرد بۆ ڕەواندنەوەی ترس و بیم و شەرم لە دڵی بوکەکەدا، وا باش و چاك و گونجاوە، کە قسەی خۆش و وتەی شیرین و خۆشەویستی خۆتی بۆ دەربڕی.

هەروا ؟

باسی جوانی و شۆخ و شەنگی و ڕازاوەیی ئەوی بۆ بکەی و بە ناوی کورت کراوە وەك نازێك بانگی بکەی.

باسی هیوار ئاوات و ئامانجی ئایندەتان بکەیت.

باسی خێزانی بە ختیار و جگەر گۆشەو بینایی چاو بکرێ، کە چۆن دەبنە ڕۆشنکەرەوەی ماڵتان لەکاتی قسە کردن نەکەی دەست بۆ هیچ شوێنێکی تر درێژ بکەی، یان یەکسەر ماچی بکەیت و شوێنی خۆت بگۆڕی و بچێتە تەنیشتیەوە.

نەكەی پەلەو خێرا بكەی بۆ جووت بوون، چونكە ئەم ڕەفتارە پڕ لەناكاوانە، كار دەكاتە سەر دەروونی بوك و، ئامادەی تەواوی تێدا نایەتە دی، كە كۆسپ و لەمپەر دروست دەكات.

وەك ئیمام (إبن قيم الجوزی) رحمه الله لە كتێبی (روضة المحبين) دا دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئەبو بەكری كوڕی محمدی كوڕی مهدی بۆی باس كردووم، كە یەكێك لە پیاوە ناو دارو گەورەكانمان لە بەغدا، كچێكی بینیوە خۆشەویستی كەوتە دڵیەوە.

جا داخوازی دەكاو دەبێتە خێزانی، لەیەكەم شەوی زاوایدا بەبێ هیچ پێشەكی و قسەو وتەی شیرین و لاواندنەوە، بە نیازی جووت بوون یەكسەر چو بۆلای بوكەكە.

بەڵام بوكەكە دەبینێ (زەكەری) پیاوەكە گەورەیە، یەكسەر لەبەر دەستی هەڵدێ و ناگەڕێتەوە لای.





ئابەم شێوەیە پەلەكردن بۆ زوو بەزاوا بوون و جووت بوون، چاوەڕوان نەكردن و نەكردنی قسەی خۆش و پێشەكیەكانی جووت بوون، دەبێتە هۆیەكی گاریگەری پچڕانی شیرازەی دوودڵ.

كەوانە زاوای
مسوڵمانی زۆر ئاگادار و
وریابە

## گەمەو یاری و ماچ کردن

- بەڵگە نەویستە ژن و مێرد وەك هەموو دوودڵی گونجاو، لێك ڕازی وادەخوازێ لەگەڵ یەکتری گەمەو یاری بکەن، یەکتری ماچ بکەن بە تایبەتی ماچی دەم و زمان مژین.

کە یەکتری ماچ دەکەن، نابێ هیچ کامێك لە بوك و زاوا سیرو پیازو کەوەرو... ئەو شتانەیان خواردبێت، کە بۆنی ناخۆشی لێ دێت بەتایبەتی جگەرە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (كل شيء ليس من ذكر الله لهو لعب الا ان يكون اربعة: ملاعبة الرجل امرأته، وتأديب الرجل فرسه، ومشي الرجل بين الغرضين وتعليم الرجل السباحة)[3].

[3] - نسائی بە ( صحیح )ی ڕیوایەتی کردووە.





لەم فەرموودەیەدا، پێغەمبەری خودا ﷺ یەك لەو کارانەی، کە بەڵەهو یاری و گاڵتەو گەپی دانانێ بریتییە، لەگەمەکردنی پیاو لەگەڵ خێزانەکەی.

- یەکێك لەزانایان دەڵێ: پێویستە لە یەکەم ساتی دەست پێکردنی جووت بوون، گەمە و یاری و جنس بزواندن لە نێوان ژن و مێردا هەبێ، چونکە نەبوونی وتەی شیرین و گەمە و دەست بازی، دڵی توند دەکات و ئازاری دەروونی پێ دەگات.

جا یاری کردن لەگەڵ خێزان، هونەرێکی گرنگی ئەو پەڕی خۆشی و چێژ وەرگرتنە.

هەروەها یەکێ لە زانا پسپۆڕەکانی جنس دەڵێ: گەمە و گاڵتە لە نێوان ژن و مێرد گرنگیەکی کاریگەری هەیە لەسەر پەیوەندیەکانی جنسدا، کە پشت گوێ خراوە.

زۆر لە پیاوان ئەوەیان كردۆتە خوو ڕەفتار، كەوا لە دوای جووت بووندا پشت لە ژنەكەی دەكات، ئەوەش نیشانەی نەفامی و گێلی یە.

دیارە ئافرەتەكەش لەو كاتەدا دەست بە دابەزینی لەزەتی جنس دەكات و، بێ بەش دەبێت لە گەورەترین سۆز و عاتیفە و خۆشی و نەشئەو چێژ وەرگرتن.

- بەڵگە نەویستە ئافرەت وەك پیاو، خاوەن نەفس و جنسە و، پیاو چۆن ئەگاتە خۆشی و لەززەت، ئەویش بەهەمان شێوە دەگاتە خۆشی و لەزەتی جنسی.

ئافرەت حەزدەكات تا كۆتایی ساتی تێر بوونی جنسی، مێردەكەی لە گەڵ بێ و پشتی لێ نەكات.

وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (اذا جامع احدكم اهله فلیصدقها... ثم اذا قضی



چەند ڕێنموییەك بۆ بوك و زاوا

حاجته قبل ان تقضی حاجتها فلا یعجلها حتی تقضی حاجتها )

واتە: گەر كەسێك لە ئێوە چوە لای خێزانەكەی بۆ جووت بوون، حەق و مافی خۆی بداتێ... پاشان گەر پیاوەكە پێویستی جنسیە كەی تێر بوو، با پەلە نەكات لەوەی، كە لەسەری هەڵسێ، بەڵكو دەبێت چاوەنوارِ بكات، تا خێزانەكەی پێویستی جنسیەكەی تێر دەبێ.

- گەمەو یاری وگاڵتە كردنی پیاو لەگەڵ ژنەكەی، گرنگترین ئەو مەسلانەیە، كە زانایانی فەلسەفەی زاوزێ لە چەرخی ئێستا دا بایەخیان پێداوە.

ئیسلامیش پێش ئەوان بە چواردە سەدە ئەمەی پێش بین كردووە، ئەمەش بۆ ئەوەی نەشارەزا و بێ ئاگا نەبن بەو هۆیانەی دەبنە مایەی بەختیاری ژن و مێرد، هەروا

تاخۆشەویستی گەرم و چەسپاو بکات لای ژن.

- جابری کوڕی عبدالله دەڵێ: (نهى رسول اللهﷺ عن المواقعة قبل الملاعبة )

واتە: پێغەمبەری خوداﷺ قەدەغەی کردووە ژن و مێرد جووت بن، گەر پێشتر یاری و گاڵتەیان لەگەڵ یەك نەکردبێ و یەکتریان ماچ نەکردبێ.

- دکتۆر محمد بن الشریف کە مامۆستای تەفسیر و علومی قورئانە لە جامیعەی ئەزهەرو سەنعاء دەڵێ: ماچ کردنی ژن و مێرد لە کاتی چوونەدەر و هاتنەوەی ماڵ، زادەی بیری شارستانیەتی ئێستا نیە، هەروا لە داب و نەریتی عەرەبەکانیشەوە هەڵنە قوڵاوە، بەڵکو ئەمە ڕەفتاری ئیسلامە، کەوا زۆر لە موسوڵمانانی پێشین، سوور بوون لەسەر ئەم ماچ کردنە.





بە تایبەتیش وای داناوە کە بە ماچ کردن نە ڕۆژو و بە تاڵ ئەبێتەوە، نە دەست نوێژ ئەشکێ، وەك خاتوو عائیشە رضي الله عنها گوتویەتی: (کان رسول اللهﷺ ینال مني القبلة بعد الوضوء ثم لایعید الوضوء) هەروەها ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەرﷺ گوتویەتی: (انه کان یقبلها وهو صائم ثم لایفطر و لایجدد وضوءا)[٤].

لەبەر ئەوە بۆ بتەو کردن و قوڵکردنی پەیوەندی نێوان ژن و مێرد، پێویستە ئەو کاتەی پیاو دەچێتە ماڵەوە ژنەکەی ماچ بکات، تا زیاتر لەگەڵ یەکتری بتوێنەوە و هەمیشە ئەو خۆشەویستیە بەدیار بخەن.

جا بۆ برە و دان بە مەسەلەی دەست بازی ماچ کردنی ژن و مێرد، بەتایبەتی (بوك و زاوا) فەرمودەیەکی پێغەمبەری خوداﷺ دەکەینە پاڵ پشت و هێزدان بەم

٤ - (الاسلام والحیاة الجنسیة).

ڕەفتارە، جابر دەڵێ: پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرمووم: ژنت مارە کردووە، یان کچ؟ جابر دەڵێ: وتم بێوەژنم مارە کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مالك والعذاري ولعابها) واتە: بۆ کچت نەهێنا تا گەمەو یاری لەگەڵ بکەیت و لیکی بمژیت، جابر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! عبدالله (حەوت، یان نۆکچی بە جێ هێشتووە، بۆیە ئەمەم مارە کردوو، تا هەڵسم بە پێ گەیاندن و گەورەکردنیان و پەروەردەکردنیان.

جابر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوعای بە خێری بۆ کردم)[5].

لە ڕیوایەتێکی موسلیم داهاتووە، کە فەرموویەتی: (فهلا جارية تلاعبها وتلاعبك!) واتە: کچێکت هێنابە کە

[5] - رواه الخمسة ( صحيح ).





گەمەی لە گەڵ بکەیت و گەمەت لە گەڵدا بکات.

یان فەرموویەتی: (تضا حكها وتضاحك) واتە: بە پێکەنینی بێنی و بە پێکەنینت بێنێ.

ئەم فەرموودەیە: (مالك والعذاري ولعابها ؟!) ئاڕاستەی موسڵمانانی کردووە کەنە تەکنە لۆجیا هەبووە و نەزانستەکان پەیان پێ بردووەو، نە ئەورووپای بە ناو پێشکەوتوو خواز پێ زانیوە.

- خاوەنی کتێبی (التاج الجامع الاصول) دەڵێ: بە هێمنی و لە سەر خۆیی مامەڵە و ڕەفتاری پیاو لەگەڵ خێزانەکەی و ئارامگرتن لە کاتی جووت بوون، تا ئەو کاتەی ئافرەتەکەش ئەگاتە نەشئەو خۆشی، ئائەمەیان بە پێویستی دائەنرێ.

هەروەها گاڵتە و گەمەو یاری کردنیش لەگەڵ خێزاندا، پێویستیەکی خۆشەویستی نێو یەکتریە.

ئەوەی مەسەلەی زمان مژین و دەم ماچ کردنی ژن و مێرد بە هێزتر و بتەو تر دەکات ئەوەیە، کە لە (صیدالخاطر)ی ئیبن جەوزی هاتووە، کە پێغەمبەرﷺ خاتوو عائیشەی ماچ دەکردو زمانی دەمژی.





## • زاوای سەنگین:

ئەوەشت لە یاد نەچێت لە کاتی ماچ کردن و گەمەو یاری لەگەڵ خێزانەکەت دا، یاری بە میتکە (بظر) بکەی چونکە (بظر) خاڵی مەرکەزی بزواندن و وروژاندنی جنسی ئافرەتە.

جا بابزانین (بظر) چی یە؟

گۆڤاری (طبیبك)ـە لێکۆڵینەوەیەکی ئامادە کردووە لە ژێر ناو نیشانی (زناد الارتعاش عند المرأة) کە مەبەستی (بظر) ئەو پارچە شەفرە گەورەیە، کە بەفەرجی ئافرەت وەیە و بە هۆی ئەوەوە لەزەت و خۆشی جنسی وەردەگرێت و وەك زەکەری پیاو وایە لە لەززەت و چێژ وەرگرتندا.

میتکە پێکهاتووە لە تۆڕێك مولولەی خوێن، کە زۆر وردە و، بەدەست لێدان ئارەزووی جنسی ئافرەت دەبزوێنێ و پێی دەگاتە نەشئەو خۆشی.

هەروا (بظر) ئەندامێكی لەزەت وەرگری جنسی ئافرەتە، كە بە هەستیار ترین شوێنی چێژ وەرگر و ور و ژاندنە، كە بە كەمترین دەست لێدان زۆرترین هەستی چێژ وەرگرتن بە دەست دێنێ.

بە تایبەتی گەر دەست لێدانەكە بەنەرمی و لەسەر خۆبێ.

(بظر) گرنگیەكی هیە، كە ئەویش گونجاندن و هاوسەنگی جنسی لای ژن و پیاو ڕادەگرێ، كە دەبێتە خۆش بەختی ژن و مێرد.

لە هەمان گۆڤاری (طبيبك)ـە دا لەم بارەیەوە دەڵێ: جا كەزانرا و دەبێ هەموو پیاوێك زانیاری و شارەزایی تەواوی هەبێ، بە ڕۆڵی كاریگەری (میتكە) لە بزواندنی جنسی ئافرەتدا، هەروەها پێویستە پیاو لە كاتی گەمەو یاری كردن لەگەڵ ژنەكەیدا یاری بە(میتكە) بكات، زۆر لەو



چەند ڕێنموییەك بۆ بوك و زاوا

ئافرەتانەش كە سروشتێكی ساغ و دروستیان هەیە، یاری كردن بە (میتكە) یان بە لاوە خۆشە، پێش جووت بوون و دوای جوت بوونیش.

چونكە یاری پێكردن لە دوای جووت بونیش، دەبێتە هۆی گەیاندنی ئافرەت، بە كامڵی و تەواوی لەزەت و خۆشی چێژی جووت بوون...

* * *

## چۆنیەتی لادانی پەردەی کچێنی

- خوێنەری خۆشەویست زاوای ژیرو تێگەیشتوو! پێش ئەوەی چەند ڕێنماییەك بخەینە بەردەستی بە ڕێزت، سەبارەت بە چۆنیەتی لادانی پەردەی کچێنی بە مەبەستی پیادە و پەیڕەو کردنی، بە باش و پێویستی دەزانین، کە زانیاریەکی تەواو بخەینە بەردەست، دەربارەی شێوە و پێکهاتەی پەردەی کچێنی.

- پەردەی کچێنی: ئەم پەردەیە ناوەوەی فەرجی ئافرەتی داخستووە و داپیۆشیوە، کە شێوەکەی بازنەیی، یان هێلکەیی یە، بەڵام لەلای زۆربەی کچدا شێوەی هیلالی وەرگرتووە.





ئەم پەردەیە بە تەواوی هەموو ناوەوەی فەرجی کچی دانە پۆشیوە، بەڵکو کونێکی تێدا ماوەتەوە، تا خوێنی حەیزی پێدا بڕوات.

- جا بە چوونە ژوورەوەی زەکەری پیاو، ئەم پەردەیە دەتەقێ و لا دەدرێ، وەك دڕان و تەقینی دەهۆڵ، گەر بە دارێك لێی بدرێ.

دەبینی پارچە دڕاوەکە وێك دێتەوە و دوو پارچەی لێ دروست دەبێت.

یەك بەلای ڕاست و ئەویتر بە لای چەپ.

ئەو خوێنەش کە بە کەمی دێتە دەر، چەند دڵۆپە و لە پێنج دڵۆپ زیاتر نیە، ڕەقی و توندی و نەرمی پەردەی کچ، دەگەڕێتەوە سەر بوونیەو لەشی کچەکە و، ئەو شوێن و ناوچەو ژینگەیەی، کە تێیدا دەژی.

هەروەها ئازاری لادانی پەردەکەش لەسەر قەبارە و ئەستوری پەردەکە و، شێوازی هەڵە لادانی پەردە دەوەستێ.

- توند و ڕەقی ئەم پەردەیەش بە تەمەنەوە پەیوەستە، تا تەمەن گەورەتربێت، پەردەکەش ڕەقتر دەبێت.

جا گەر کچ تەمەنی گەیشتە (٣٠) ساڵی و، هەر بە کچێتی مابێتەوە و شوی نەکردبێ، ئەوا پەردەکەی توندتر و ڕەقتر دەبێت.

دکتۆر (فريد ويك كهن) لە کتێبکەیدا (حياتنا الجنسيه) دا دەڵێ: سەبارەت بە لادانی پەردەی کچێنی، پێویستە ئاماژەی ئەوە بکرێ، کە زۆربەی پیاو (زاوا) لە شەوانی یەکەمی زاواییدا، ناتوانن ئەو پەردەیە لابدەن.





ئەمەش لەبەر دوو دڵی و قەڵەق و ناکۆکی و نائارامی دەروونی، یان لەبەر توند و ڕەقی پەردەی ئافرەتەکە.

- لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر هاوڕێی و خزمی بوك و زاوا، گرنگی نەدەن بە مەسەلەی لا نەبردنی پەردەی کچێنی لە یەکەم شەودا، هەروەها گوێ نەدەن بە قسە و قسە لۆك و گوتەو لۆمەکاری خەڵك.

گاڵتەش بە زاوا نەکەن و سەر زەنشتی نەکەن، چونکە سەر زەنشت کردنی زاوا، دەبێتە هۆی خاو بوونەوە و شلی زەکەری، کەئەمەش کارێکی خەتەر ناکە و سامناکە، هەڕەشە لە ژن و مێرد دەکات.

خاوبوونەوەی زەکەریش دوو جۆری هەیە: (ئەندامی و دەروونی) خاو بوونەوەی دەروونیی، پەیوەندارە بە حاڵەتی مێشکەوە.

دەتوانم بڵێم ئەو کەسەی لە ناخی دڵ و دەروونەوە، متمانە و باوەڕی وابێ، کە لەم

بوارەدا (لادانی پەردەی کچێنی) سەردەکەوێ، ئەوا بێگومان سەر کەوتو دەبێ و زاڵ دەبێ بەسەر ئەم حاڵەتە.

هەروەها دەڵێ: هەندێ کەس باسی داب و نەریتێکی خراپیان بۆ کردووم، کە لە هەندێ لادێکان پەیڕە و دەکرێ و بووەتە خویان، ئەویش ئەوەیە: گەر زاوا لە یەکەم شەودا نەیتوانی ئەم پەردەیە لادات و بە زاوا نەبێت، ئەوا هاوڕێکانی هەڵدەستن بە گاڵتە و یاری پێکردن و تۆمەتی خاوی و شلی زەکەری ئەدەنە پاڵ.

- کاتێکیش کوڕەکە بە زاوا بیێ، ئەوا تۆمەتی ئارەزوو هەڵسان دەدەنە پاڵ کچەکەوە و دەڵێن: گەر وانیە بۆچی لە یەکەم شەودا خۆیدا بە دەستەوە! جا ئەو کاتە لەبەر ئەم بیرو بۆ چوونە گەندەڵ و هەڵەیەی هاوڕێ و خزمانی، بوك نایەڵێ زاوا جووت بیێ، زاواش بۆ ئەوەی لە گاڵتە



چەند ڕێنموییەك بۆ بوك و زاوا

کردنی هاوڕێکانی ڕزگار بێ، دەست دەکات بەلێدانی بوك.

ئەم داب و نەریتە و ڕەفتارەی باسکرا، کە زیاتر لە نێو چینی عەشایەر و تێ نەگەیشتوان بەر چاو و دیارە و، پەیڕەو دەکرێ، ڕەفتارێکی پیسی نێو کۆمەڵی نەفامیە و، ئیسلام هەردەم ئەم کارانە ڕەت ئەکاتەوە و بە کارێکی ناشارستانی لە قەڵەم دەدات.

- جا سەبارەت بە چۆنیەتی لابردنی پەردەی کچێنی، چەند خاڵێك دەخەینە ڕوو، کە پێویستە زاوا و بووکی مسوڵمانی ژیر و عاقڵ، لە سەر خۆیان بێننە دی و پیادەی بکەن.

١- بە قسە و وتەی شیرین و لاواندنەوە و پیا هەڵدان و کورت کردنەوەی ناوی خۆش و بەنەرمی ڕەفتار کردن لەگەڵ ئافرەتەکە، کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم

لابردنی پەردەکە نامێنێ و، بە ئاسانی کارەکە جێبە جێ دەبێ.

٢- گەر لە دوای نەمانی پەردەی کچێنی، بەربوونی خوێن بەردەوام بوو، ئەو کاتە پێویستە ئافرەتەکە پشو بدات و بەحەساوەیی بمێنێتەوە و هەردوو ڕانی بۆ ماوەیەك پێکەوە بنوسێنێ و جووتی بکات، زاواش ئارام بگرێ و نەچێتە لای، تا خوێنەکەی دەوەستێ.

٣- لە سەر بوك پێویستە، کە دوای نەمان و لابردنی پەردەی کچێنیەکەی، گرنگی بە پاك و خاوێنی بدات و، مادەی پاك کەرەوە بە کاربێنێ، تا برینەکەی چاك دەبێتەوە.

٤- لەسەر زاوا پێویستە بۆ جووت بوون، مادەی ڕۆنی بە کاربێنێ و لە زەکەری بدات، وەك ڕۆنی (لین) کە لەبازاڕەکاندا دەست دەکەیت.





ئەمەش بۆ ئەوەی لە کاتی دخول پێکردندا، ئافرەتەکە ئازاری پێ نەگات، و نەبادا دووچاری خوێن بەربوون (نزيف الدم) ببێت.

٥- گەر لە ڕۆژانی یەکەم و هەفتەی یەکەم ئەم پەردەیە لانە درا، یان بە زەحمەت لادەدرا، ئەو کاتە دەبێ هەردووکیان بچنە لای پزیشکو، ئەو خواردن و خواردنەوانە بخۆن و بخۆنەوە و مەوادی بە هێزکەر بە کاربێنن، کە پزیشك ئاماژەی بۆ دەکات.

وەك: گۆشت و قەرنابیت و هێلکە و برنج و ماسی و گێزەر و بیبەر و لیمۆ و پیاز و کەرەوز و مەعدەنۆس و نەعنا و سلق و قاچی مەڕ و گۆشتی باڵندە.

* * *

## چۆنیەتی جووت بوون

پێش ئەوەی باسی چۆنیەتی جووت بوون بکەین، بە پێویستی دەزانین تیشك بخەینە سەر ئەم مەسەلەیە:

جووت بوون کردارێکی یەکجار حەساس و ناسکە و، پڕە لە سۆز و عاتیفە و خۆشەویستی.

پێویستە گشت لایەك ئەمە بزانێ، لە کاتی ئەنجام دانی ئەم کارە، بە بیستنی دەنگێك... هاوارێك... تەپەتەپێك، یان بزانێ، کە چاوەڕوانیانن و ئاگادارن بە مەسەلەکەیان، ئەو کاتە کاری جووت بوون و مەرامەکانی نایەتە دی و، زەکەری پیاوەکە لەوانەیە خاووشل ببێتەوە.





لەبەر ئەوە لەسەر گشت دایك و باوك و خوشك و برایەکی مسولمان پێویستە ئاگاداری ئەمە بن.

کاتێك بوك و زاوا ئەچنە ژووری بە یەك گەیشتن و خۆشی و شادی ڕەوشێکی ئارامیان بۆ فەراهەم بکەن و بە جێ یان بێڵن، بە هیچ شێوەیەك بەربووك چاوەنواڕیان نەکات، یا لە گەڵیان نەبێت، ئەم دیاریدەیە هەڵەیە بە زۆری لە نێو چینی عەشایەر و تێنە گەیشتو و بەر بڵاوە، کە دەبێتە هۆی توڕە بوونی خوای گەورە.

چونکە لەو بەر بوکانە هەیانە، کە لەدرزی دەرگاوە، یان شوێنێکی ترەوە تەماشایان دەکەن و نهێنی ئەو شەوەیان دەزانێ و، لە وانەیە بڵاوی کاتەوە.

بەم کارەش بەر هەڕەشەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوێت، کە دەفەرموێ ئەو

کەسانەی نهێنی ژن و مێرد بڵاو دەکەنەوە لە ڕۆژی قیامەت بە خراپترین خەڵك (شرالناس) دادەنرێت.

هەروەها دایك و باوك... خزم و کەس، نابێ چاوەنواڕی ئەوەبن، کە یەکەم شەو، دەبێ شەوی بە زاوا بوون بێ، چونکە هەروەك پێشتر باسمان کرد، ئەو مەسەلەیە زۆر حەساس و دەقیقە نا ئارامی و دڵە ڕاو کێ و ناکۆکی نەفسی و نەخۆشی، کاردەکاتە سەر بە زاوا نەبوون، کە بەزاوانەبوون لەیەکەم شەو شتێکی زۆر ئاساییە و، تەنانەت واچاکە یەکەم شەو، شەوی یەکتر ناسین و دەربڕینی خۆشەویستی ڕەواندنەوەی ترس و لەرزی مەسەلەی بە یەك گەیشتن و جووت بوون بێت، تا ئافرەتەکە بە تەواوی ئامادەی دەردەبڕێ.

جا ئێستا دێینە سەر باسی چۆنیەتی جووت بوون و حاڵەتەکانی: زاوای بە ڕێز و





مسوڵمان! لە دوای جێبەجێکردنی پێشەکیەکانی جووت بوون (ماچ و وتەی شیرین و یاری گەما کردن) و ئامادە بوون بۆ گەیشتن بە لەحزەی چێژ و خۆشی، ئەوا ئەو کاتە سونەتێکی پێویستە بڵێی (بسم الله اللهم جنبنا الشيطان، وجنب الشيطان مارزقتنا)[٦]. واتە: بە ناوی خوا، خوایە خراپە کاری و شەیتانمان لێ دووربخەوە و ئەو منداڵەش، کە پێمانە دەبەخشی شەیتانی لێ دوور بخەرەوە.

جا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (فان قضى الله بينهما لم يضرالشيطان ابدا)[٧]. واتە: گەر ژن و مێرد لە کاتی جووتبووندا ئەم دوعایەیان خوێند، ئەوا گەر خوای گەورە منداڵی پێدان بە هۆی ئەم جوت بوونە، ئەوا

[٦] - بوخاری ڕیوایەتی کردووە،
[٧] - بوخاری و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردووە،

هەرگیز شەیتان ناتوانێ زەر و زیان بە منداڵە كە بگەیەنێ.

بۆ چۆنیەتی جووت بوون دوو حاڵەت هەیە، وەك كتێبی (حیاتنا الجنسیة بتصرف) باس دەكات:

یەكەم: ئافرەتەكە لەسەر پشت پاڵ بكەوێ و هەردوو ڕانی بكاتەوەو، بەرزی كاتەوە بەمەش هەردو شەفرەی بچوكی فەرجی ئافرەتەكە دەكرێتەو و دخول پێكردنی ئاسان دەبێ، ئەم جۆرە حاڵەتە حاڵەتی نوێیە.

دووەم: پیاوەكە لەسەر پشت پاڵ بكەوێ و ئافرەتەكە بچێتە سەر زەكەری پیاوەكە و، لەسەر خۆو بە هێدی لەسەر خۆیی وردە وردە دەست بە جوڵە جوڵ بكات، جا بەو شێوەیە زەكەری پیاوەكە بە هێدی و دەقیقی دەچێتە ناوەوە.





ئەم جۆرە حاڵەتە مرۆڤی یەكەم جار بەكاری دەهێنا، وەك كە لە نوسین و وێنەكانی كۆن ئەمە بە دەردەخەن، ئەم حاڵەتەش بۆئەو كەسانە باشە كە شەكەت و ماندوون.

لە هەردوو حاڵەتەكەدا چاك وایە هۆكاری ساف و لوسی بۆ بەكاربهێنرێت.

وەك جۆرەكانی كرێم و وازەلین و شتی دیكە، تا دخول پێكردنەكە بە ئازار نەبێت و ئاسان بێت.

- هەروەها چاك وایە دوای دخول پێكردن و لادانی پەردەی كچێنی پەلە نەكرێت، بەڵكو پشو بدرێت و دەست بە جێ پیاو داوای جووت بوونی تر نەكات، بە لایەنی كەمەوە تا(٦) سەعات دواتر پش و بدرێت.

- هەروا بۆ ئارام بوونەوە و ڕەواندنەوەی ئەو ترس و بیمەی کە لەلای ئافرەتەکە دروست کرابوو.

* * *





## • لە کۆتاییدا

ئەوەی لەم لاپەڕانەدا چەند ڕێنمویی و زانیاریەك باس کرا، زیاتر تایبەت بوو بە ئەرك و ڕەفتاری پیاو.

بەڵام بابە کورتی ڕۆڵی گرنگی ژن باس بکەین.

لە کتێبی (تحفة العروس)دا لا پەڕە(٤٢٩)سەبارەت بە ڕۆلی ژن هاتوە دەڵێ: ژن (الزوجة) ڕۆڵ و دەورێکی هەرە گرنگی هەیە، بۆ بەختیار کردنی مێردەکەی و بۆ پاراستنی پیاوەکەی لەو شتانەی، کە دەبنە هۆی سەرنج ڕاکێشان و لەخشتە بردنی لە دەرەوەی ماڵ دا... ئافرەتی لێزان و کارامە و لێهاتوو ئەو ئافرەتەیە، کە بە هۆی خۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەی بۆ مێردەکەی، ناهێڵێ ئافرەتی کۆڵۆن لەبەر و تەنورە تا سەر چۆك هەڵکرد و پانتۆڵ تەسك بەدی لەبەر و

سینگ ڕوت، سەرنجی مێردی ڕابکێشێ و فریوی بدات و توشی لادانی بکات.

واتە بە لێزانی و کارامەیی خۆی، قەرەبووی ئەم هەموو ئیغرا کردنانەی لەدەرەوە هەیە بۆ مێردەکەی دەکاتەوە ئەویش بە لە بەر کردنی ئەم جلانە بۆی لەماڵەوەدا کە، ئەم شەرعیانە هەڵدەستێ و ناهێڵێ مێردەکەی توش بێ و هەڵخلیسکێ.

دیارە ئەوەش پاداشتێکی گەورەی هەیە و پاڵپشتێکی گەورەشە بۆ دروست کردنی داوێن پاکی و پتەو کردنی نێوانیان.

هەروەها ژنی سەر فراز و سەر کەوتوو ئەو هاوسەرەیە کەوا مێردەکەی چی پێ خۆشە و حەزی لێ یە بۆی لەبەر بکات و بی پۆشێ، لە جل و بەرگ و ڕەنگ و جل و بەرگی ناوەوە (الملابس الداخلية)دا.



چەند ڕێنموییەك بۆ بوك و زاوا

هەروەها چ ڕازاندنەوەیەکی پێ خۆشە خۆی بەو شێوەیە بڕازێنێتەوە.

ئافرەت و هاوسەری سەر لە خۆ تێکدەر و بەد بەخت ئەو ژنەیە، کە خۆی بۆ مێردەکەی جوان ناکات و خۆشی فەرامۆش (إهمال) دەکات.

تەنانەت لە کاتی گەڕانەوەی مێردەکەی بە جل و بەرگی چێشت لێنان و بۆنی چێشتاوی قژی ئاڵۆز، پێشوازی لە مێردەکەی دەکات.

ئەم جۆرە ڕەفتارەش دەبێتە هۆی گوێ پێ نەدانی پیاوەکە بە ژنەکەیەوە، هەرچەند جوان بێت، ناچار دەبێت چاو بگێڕێ بۆ ئافرەتێکی تر جا ئامۆژگاری ژن دەکەین، کەخۆی بۆ مێردەکەی جوان بکات و بڕازێنێتەوە و گرنگی پێ بدات و، لە کاتی گەڕانەوەی مێردەکەی بۆ ماڵەوە سکاڵای چەقاوەسوویی و بزۆزی منداڵەکانی لەلا

نەکات، هەوڵ بدات حەوانەوەی بۆ فەراهەم بکات و بە نازی ژنانەی خۆی، خۆشەویستی بۆ دەربڕی و ماندوێتی بڕەوێنێتەوە هەروا کەشێکی ئارام و خۆشی بۆ بڕەخسێنی، وەك داگیرسانی ڕوناکی هێدی کەرەوەی مێشك و، نەهێلانی دەنگە دەنگی منداڵەکانی، بڵاوکردنەوەی بۆنی خۆش بە ماڵداو، ئامادەکردنی ئەو چێشتەی ئەو حەزی لێ دەکات و بۆی بکات بە(مفاجاه).

بۆ بەردەوامی گەشەی پەیوەندی جنسی پێویستە، (فەرجی) پاك و خاوێن ڕابگری و بۆنی خۆشی پیا بکات.

بۆ کرداری جووت بوون ژوورەکەی بۆنخۆش بکات، کاتێکیش مێردەکەی ماچی دەکات با ئەویش ماچی بکات.

* * *





• ئێبینی

بوك و زاوای مسوڵمان، خوێنەری ئازیز:

لەوانەیە بە لاتەوە شتێکی زۆر نامۆ و سەیربێ، کە بێ پەروا بە ڕاشکاوی باسی مەسەلەی جنسی کراوە، لەوانەشە گلەییەکی زۆریش بکەن.

## • بەڕێزینە!

من لە ژێر تیشکی فەرمودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر ﷺ و وتەی زانایان، هەڵم هێنجاوە و باسم کردووە خوای گەورە و پێغەمبەری ئازیز و هاوەڵە بەڕێزەکانیش، ئەم مەسەلەیان زۆر بە ئاشکرا و بە ڕاشکاوی بە مسوڵمانانیان گەیاندووە، تا مرۆڤی مسوڵمان، بە عیفەت و داوێن پاکی و بە ئەدەبەوە فێری پەروەردەی جنسی بێ و، بەدروستی ئەو مومارەسەیە ئەنجام بدات و توشی لادان نەبێت.





## سەرچاوەکان


١- (تحفة العروس او الزواج الاسلامی السعيد) چاپی چوار - محمود مهدي الاستنابولی.

٢- (الاسلام والحياة الجنسية) دكتور محمود بن الشريف.

٣- (الرجل والمراة فی الاسلام) ل ٢٦٨.

٤- (الجنس فی حياة كل انسان) دكتور عبدالمحسن بيرم.

## ناوەرۆك

**ئەم نامیلکەیە ..**

* سەرەتای بەیەکگەیشتن و چۆنیەتی دروست بوونی خۆشەویستی لەنێوان ژن و مێرد روون دەکاتەوە.

* باسی سوننەتەکان و رێگا شەرعیەکانی ژوانی یەکەم دەکات.

* باسی ئەو ئاکارانە دەکات کە پێویستە بووک و زاوا بەرامبەر بەیەك ئەنجامی بدەن.

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر

نرخی 1500 دیناره